## بزانە الله ڕێنمونیت بکات بۆ گوێڕایەڵی خۆی:

بزانە کە الله تۆی دروستکردوە بۆ بەندایەتی خۆی بەتەنها وبەموخلیصی، هەروەك الله دەفەرموێت: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ} [الذاريات: 56] ، واتا (الله مرۆڤ وجنۆکەی دروست نەکردووە تەنها بۆ بەندایەتی نەبێت). جا ئەگەر ئەوەت زانی؛ بزانە عیبادەت پێی ناوترێت عیبادەت ئەگەر تەوحیدی لەگەڵ نەبێت، هەروەکو چۆن نوێژ بە نوێژ ناونابرێ ئەگەر دەستنوێژی لەگەڵ نەبێت؛ جا ئەگەر شیرك بۆ الله تێکەڵاوی عیبادەت بوو خراپی دەکات وەکو چۆن شکانی دەست نوێژ نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

ئەگەر زانیت شیرك ئەگەر تێکەڵاوی عیبادەت بوو ئەوە خراپی دەکات وە بکەرەکەی دەکات بە یەکێك لەوانەی کەوا بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخ دەمێنێتەوە؛ هەروەك الله دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ}، واتا: (الله لە شیرك خۆش نابێت خۆش دەبێت لەجگە لەشریك بۆ ئەوەی کەبیەوێت). زانیت کەگرنگترین شت لە سەرت ئەوەیە کە تەوحید بزانیت لەگەڵ دژەکەی لە شیرکی گەورە، وە ئەوەش بە ناسین وشارەزابوونی چوار بنەماکە دەبێت کە الله لە قورئان باسی کردووە، ئەوانیش:



**بنەمای یەکەم:** ئەوەیە کە بزانیت کە ئەو کافرانەی پێغەمبەر ﷺ شەڕی لەگەڵ کردن دانیان بەوە دەنا کە الله خالیقە وە هەڵسوڕێنەری گەردوونە، بەڵام ئەوە نەیخستنە ناو ئیسلام، بەڵگەش فەرمایشتی الله_یە: {قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ}.

**بنەمای دووەم:** ئەو موشریکانە دەیانگوت: ئێمە هاواری پیاوچاك وبتەکانمان نەکردوە وڕومان تێنەکردوون تەنها لەبەر نزیکبونەوە لە الله وتکاکردن لێی نەبێت، بەڵگەش بۆ نزیکیەتی الله تعالی دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى}، بەڵگەی تکاکردنیش الله تعالی دەفەرموێت: {وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ}.

بانگەشەی ئەو موشریکانە نەبووە هۆی هەڵگرتنی شیرك لەسەریان.




**بنەمای سێیەم:** بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر ﷺ لە ناوخەڵكانێك دەركەوت وە بوو بە پێغەمبەر كەوا جیاواز بوون لە عیبادەتەكانیان، هەیان بوو فریشتەی دەپەرست وە هەیان بوو كە پێغەمبەران وپیاوچاكانی دەپەرست وە هەیان بوو كە بەرد وداریان دەپەرست وە هەیان بوو ڕۆژ ومانگی دەپەرست پێغەمبەر ﷺ شەڕی لەگەڵ هەموویان كردو جیاوازی نەكرد لە نێوانیان، بەڵگەش الله تعالى دەفەرموێت: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ}.

**بنەمای چوارەم:** موشریكەكانی سەردەمی ئێمە شیركەكانیان زۆر خراپترن لە موشریكەكانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەوەی موشریكەكانی سەردەمی پێشوو لەكاتی خۆشی وئاسودەیی دا شیركیان دەكرد و لە ناخۆشی دەگەڕانەوە بۆ لا الله، بەڵام موشریكەكانی ئەم سەردەمە لەسەر شیركیان بەردەوامن لە خۆشی وناخۆشی شیرك دەكەن، بەڵگەش الله تعالى دەفەرموێت: {فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ}.

پەروەردگارا بمانژێینە بە موەحیدی، وبمانمرێنە بەموەحیدی،
وحەشرمان بكە لەگەڵ كۆمەڵەی موەحیدان.